

# فەرهەنگی ئاڤێستا

# بۆ

# فێربوونی زمانی ڕوسی...

ڕێزمان – گفتوگۆ

# УЧЙ РУССКИЙ ЯЗЫК

## Разговор и грамматика


**АВЕСТА НАХРО** **НАХРО АЛИ**

ئامادەکردنی

**د. نەهرۆ عەلی** **ئاڤێستا نەهرۆ**









# پێشەکی

## Предисловие
## پریدیسلۆڤیێ

زمان خۆی لەخۆیدا ئەو ئامرازە هەرە گرنگەیە کە زانیاری بەهەموو لقە جۆربەجۆرەکانیەوە دەگوێزرێتەوە. بۆیە هەر لاوازییەك لە زماندا، نەبوونی چەمك و ووشەو زاراوەی پڕبەپڕو تایبەدمەند بەرامبەر بەهەموو چەمك و زاراوەیەکی بیانی، دەستەوستانی و دۆش دامانی ئەو زمانە دەردەخات کە ناتوانێت لەگەڵ ڕەوتی خێرایی پێشکەوتنی سەردەمدا سەردەمی جیهانگیریدا هەنگاوبنێت.

ئێمەی کورد ، کە ئەمرۆکە هێشتا لە کاروانی پێشکەوتنی ئەم جیهانەدا زۆر لە دواوەین، لە هەموو نەوتەوەیەك زیاتر پێویستمان بە ئاشنایەتی و زانین هەیە لە هەمووبوارەکانی ژیاندا. ئەمەش بەبێ زانینی زمانانی بێیانی بە تایبەتی زمانە زیندووەکانی جیهانی جێبەجێ نابێت. هەروەك ئاشکرایە زمانی ڕوسیش زمانێکی زیندووی جیهانییە کەوەك کلیلێك وایە بۆ چوونە ناو شارستانیەت و کلتوورو زانستی دەوڵەمەندی ڕوسیاوە. بۆیە بەئەرکی سەرشانی خۆمان زانی کەبە شێوەیەکی تایبەت خوێنەری کورد ئاشنابکەین بە زمانی کەڵە نووسەرانی وەك پوشکین، چێخەڤ ، دەستێۆفسکی، گۆرکی... هەروەها بەزمانی زانایانی وەك مەندێلیف و لەمانۆسەڤ ...هتد.

ئەم فەرهەنگە چکۆلەیە یەکەم فەرهەنگی ڕوسی –کوردییە کە بە زاراوەی

(دیالێکتی) خواروو (سۆرانی) نوسراوە.

ئەم فەرهەنگەی کە لەبەردەستاندایە بە شێوەیەکی سادەو ساکار یارمەتی فێربوونی زمانی ڕوسیتان

دەدات چ بۆ خوێندکارو قوتابیان وە چ بۆ گەشتیارو سەوداکاران کە دەیانەوێت لە وولاتەکانی پێشووی یەکێتی سۆڤیەتدا کارەکانیان بە ئەنجام بگەیەنن.

ئەمڕۆکە پەیوەندی ئابووری و کلتووری و ڕامیاری نێوان میللەتان زیاتر چڕتر دەبێتەوە. ئەوەی جێگەی گومان نییە ئێمەی کورد پەیوەندیەکی دێرین و مێژوویمان هەیە لەگەڵ میللەتانی وولاتانی یەکێتی سۆڤیەتی کۆندا لەبەر ئەو هۆیە و گرنگیەتی ڕوسیا وەك زلهێزێکی جیهانی ئەم فەرهەنگە جگە لە لایەنە زانستیەکەی و دەوڵەمەند کردنی زمانی کوردی ، لایەنێکی پراکتیکیشی هەیە وەکو سەرچاوەو دەلیلێك بۆ یارمەتی ئەو کوردانەی کە دەیانەوێت فێری زمانی ڕوسی ببن.

بێگومان فێربوونی زمان بەبێ زانینی ڕێساو ڕێزمان کاریگەری نابێت بۆیە لەم فەرهەنگەدا بەشێکی زۆری تەرخانکراوە بۆ ڕێزمانی زمانی ڕوسی کەیەکێکە لە ڕێزمانە گرانەکانی جیهان.

فەرهەنگەکە جۆری فۆنەتیك و نووسینی ووشەی سادەو ووشەی لێکدراوپێکەوە بەستراو لە وانەو بنیاتی ڕێزمانیدا ڕووندەکاتەوە. ئیدیۆم و قسەی نەستەق و پەندیپێشینان و فرازیەلۆژی ڕێزمانی نیشان دەدات و دەری دەخات.

ووشە ڕوسیەکان بەپیتی عەرەبی نووسراون چونکە باشترین ڕێنوسێکە کە لەگەڵ فۆنیۆم و ووشەی کوردیدا دەگونجێ. یارمەتیەکی باشی ئەو کەسانە دەدات کە بۆ یەکەم جار دەیانەوێت ئاشنا بن بە زمانی ڕوسی.

مەبەستی سەرەکی لەم فەرهەنگە دابینکردنی پێداویستیەکانی زمانەوانی خوێندکاری کوردە لە قۆناغە جیاجیاکانی خوێندندا وە بگرە تەنانەت لە

ژیانی ڕۆژانەشیاندا، بەو هیوایەی کە بڕێك لە ئەرکی سەرشانیان کەم بکرێتەوە. وە کەلێنێکی بچوکمان لە بواری فەرهەنگدا پڕکردبێتەوە.

لەکۆتایدا بە ئەرکێکی پێویستی دەزانین کە سوپاس و ڕێزی بێپایانی خێزانەکەم و دایکی ئاڤێستا ئانیا بکەین لە پارمەتی زمانەوانیدا بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە. وەهەروەها سوپاس و ڕێزی شایستەمان ئاڕستەی هەموو خوێندکارە کوردەکانی ئۆکرانیا بە تایبەتی شاری دانێتسك بکەین.

هەروەها سوپاس و ڕێزمان بۆ بەڕێز(ئومێد محەمەد ساڵح) کە بەو پەڕی سەرنجەوە پارمەتی هەمەلایەنی داوین .

تکاو هیواشمان لە ڕۆشنبیران و پسپۆڕان و خوێندەوانان ئەومیە کە بە چاوێکی دڵسۆزانەوە لەم فەرهەنگە بڕوانن چی کەمکوڕیەکی تێدایە ئاگادارمان بکەنەوە ، ئەم کارە بەئەرکێکی سەرشانی خۆیانی بزانین بۆ ئەوەی بتوانین لە دوارۆژدا فەرهەنگێکی گەورەترو دەوڵەمەندتر و باشتر ئامادەبکەین.

د. ئەهرۆ عەلی
ئاڤێستا ئەهرۆ
ئۆکرانیا ۲۰۱۰

# هەندێ زانیاری گشتی دەربارەی ڕوسیاو کۆمارەکانی پێشووی یەکێتی سۆڤیەت

کاتێك لە شاری ڤلادیڤەستۆك( Vladivastok) ی ڕوسی ڕۆژئاوادەبێت ، لــە شــاری مۆســکۆ ڕۆژهەڵــدێت، هەرچــەندە ڤلادیڤەســتۆك دوا نوختــەی ڕۆژهەلاتی ڕوسیا نییە ، دورگەی بیرینگ زۆر لەو نوختەیە دوورترە.
کاتێك باکووری ڕوسیا بەفرداپۆشیوە لە خـوارور ڕوسـیا خورمـا پێـدەگات. ئەمەش گەورەیی و فراوانی ڕوسیا نیشاندەدات.
ڕوسـیا لەگـەڵ کۆمارەکـانی تـری یـەکێتی سـۆڤیەتی کۆنـدا دەورە دراوە بـە دوازدە دەریا و هەرسێ ئۆقیانوسی ئەتڵەسی و ئارام و بەستەڵەکی باکوور.
زۆرترین تۆڕی ڕووباری یەکێتی سـۆڤیەتی کـۆنی تەنیوەتـەوە کـە ژمارەیـان لە سەدهەزار ڕووبـار زیـاترە لـە نێوانیانـدا گـەورەترین ڕووبـاری جیهـانی وەك ئــاوب ، ئــامور، ڤۆلگــا. وە زیــاتر لــە دوســەدوپەنجاهەزار دەریاچــەی تێدایــە گەورەترینیان دەریاچەی قەزوین ، وەهەروەها قوڵترین دەریاچە بایکاڵ.
ڕوسـیا لەهـەمان کاتـدا دەکەوێتـە هـەردوو کیشوەری ئاسـیاو ئـەوروپاوە کـە ڕێــژەی (٢٥٪) ی دەکەوێتــە ئــەوروپاو لــە (٧٥٪) دەکەوێتــە ئاســیا. درێــژی زەویەکـەی لـە ڕۆژئـاواوە بـۆ ڕۆژهـەلات نزیکـەی دەهـەزار کیلۆمـەتر و وە لـە باکوورەوە بۆ باشوور نزیکەی پێنج هەزار کیلۆمەترە.
ئەوەی جێگەی ئاماژەپێدانە ڕوسیا پێکهاتووە لە سەدان میللـەت و نەتـەوەی جیاواز جیاواز ئەمەش بۆتـە هـۆی دەوڵەمـەنکرن و هەمـەجۆری کلتووری ئـەو وولاتە.

# ڕوسیاو کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی کۆن

یەکێتی سۆڤیەتی کۆن پێکهاتبوو لە ١٥ کۆماری سەربەخۆ. ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی ٣٠٠ ملیۆن کەس ، ڕووبەری زەویەکەی ( ٢٢,٢٩٩,٠٠٠) ملیۆن کیلۆمەتر چوارگۆشە:

| ناوی کۆمار | پایتەخت | ڕووبەر هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە | ژمارەی دانیشتوان ملیۆن |
|---|---|---|---|
| ڕوسیای فیدراڵ | مۆسکۆ | ١٧٠٧٦ | ١٦٠ |
| ئۆکرانیا | کییف | ٦٠٤ | ٤٨ |
| کازاخستان | ئەستانە | ٢٧١٨ | ١٦ |
| وزبێکستان | تەشقەند | ٤٤٨ | ١٧ |
| بیلەڕوس | مینسك | ٢٠٨ | ١٢ |
| ئازەربایجان | باکۆ | ٨٧ | ١٠ |
| جۆرجیا | تیبلیس | ٧٠ | ٦ |
| کیرگیزیا | بیشکێك | ١٩٩ | ٥ |
| تاڵجیکستان | دوشەنبە | ١٤٣ | ٤ |
| لیتوانیا | ڤیلنیوس | ٦٥ | ٤ |
| مەڵدۆڤیا | کیشینیۆڤ | ٣٤ | ٦ |
| تورکمێنستان | ئەشخاباد | ٤٨٨ | ٤ |
| لاتڤیا | ڕیگا | ٦٤ | ٣ |
| ئەرمێنیا | یەریڤان | ٣٠ | ٤ |
| ئیستۆنیا | تالین | ٤٥ | ٣ |

# ڕوسیای فیدراڵ

ڕوسیای فیدراڵ ڕووبەرەکەی درێژبۆتەوە لە نێوان دەریای بەڵتیق تاکو ئۆقیانووسی ئارام وە هەروەها لە نێوان ئۆقیانووسی بەستەڵەکی بکوور تاکو دەریای ڕەش و قەزوین. ڕوسیا گەورەترین وولاتی جیهانە بە ڕووبەر . سنوورەکەی لە باکوورو ڕۆژئاواوە بەستراوە بە فینلەندا، پۆڵۆنیا، نەرویج، ئیستۆنیا، لاتڤیا، لیتوانیا، بیلەڕوس، ئۆکرانیا، تورکیا، ڕۆمانیا، چیك، وە بە ئیران و ئەفغانستان لە باشوورەوە. بەلام لە ڕۆژهەلاتەوە بەستراوە بە کۆماری جۆرجیا، تورکیا، کازاخستان، کۆریای باکوور، مەنگۆلیا و چین. جگە لە نەتەوەی ڕوس لە خاکی ڕوسیادا چەندان میللەت و نەتەوەی دیکە دەژین. ڕوسیا پێکهاتووە لە شانزە کۆماری سەربەخۆ و پێنج کەرتی ئۆتۆنۆمی و دە بنکەی تایبەتی تر بۆ نەتەوەکانی دیکە .

## مۆسکۆ

مۆسکۆ پایتەختی ڕوسیای فیدراڵە ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی ١٢ ملیۆن کەسە. ئەوەی بۆ یەکەم جار سەردانی مۆسکۆ دەکات دەچێت بۆ گۆڕەپانی سوور و کرەملین ، گۆڕپانی سوور بە زمانی ڕوسی واتە گۆڕەپانی جوان کە بەبەردی سوورر نەخشەکراوە، لە لایەکەوە بە کاتژمێری ناسراو بە بورجی سپاسکی لە لایەکی دیکەوە بە دیواری کرەملین دەورەدراوە، بەرامبەرەکەی کەنیسەی کۆنی ڤاسیلی کە زیاتر لە چوارسەدە لەمەوپێش وەك ڕەمزێك بۆ بۆ سەرکەوتن بەسەر خانی کازاندا دروستکراوە.

مۆسکۆ نزیکەی سەدوپەنجا مۆزەخانەو پێشانگای کلتووری و مێژوویی و هونەری و زانستی تێدایە. هەروەها نزیکەی چل شانۆ لە هەرە گرنگ و بەناوبانگەکانی شانۆی گەورە ، شانۆی ستانیسلاڤسکی، شانۆی ئۆپێرا و شانۆی هونەری مایکۆڤسکی و پوشکین.

مۆسکۆ زیاتر لە هەشتا دەزگای زانستی و زانکۆو سەنتەری لێکۆڵینەوەی تێدایە.

## سانتسپیتربورگ (لێنینگراد)

سانتسپیتربۆرگ یەکێکە لە هەرە شارە جوان و دڵگیرەکانی جیهان ، کەسەیری ئەو شارە دەکەیت هێزو توانای مرۆڤمان لە بواری تەلارسازیدا بۆ دەردەکەوێت. ڕووباری نیڤا بە نێوەندیدا تێدەپەڕێت کە ئەوەندەی دیکە شارەکەی جوانتر کردووە، جگە لەوەش پێنج دوورگەو نیمچە دوورگەی تێدایە. نزیکەی پێنج سەد پردی تێدایە کە بیست و چوارپردیان دەکرێنەوە. ئەو شارە ناسراوە بە شاری مۆزەخانە بە جۆرێک گەورەترین مۆزەخانەی جیهانی (ئیرمیتاژ) دەکەوێتە ئەو شارەوە کە پێکهاتووە لە ٣٢٢ هۆڵی پیشاندان و نزیکەی دووملیۆن و چوارسەدهەزار تابلۆی هونەری تێدایە.زیاد لە پانزە گەورەو دێرین سانتسپیتربۆرگ دەرازێننەوە لە هەرە گرنگەکانیان شانۆی کیرەف بۆ بالیە و شانۆی درامای پوشکین و گۆرکی و چەندانی دیکە.

هەروەك پێشتر ئامازەمان پێدا ڕوسیای فیدراڵ پێکهاتووە لە شانزە کۆماری سەربەخۆو پێنج ناوچەی ئۆتۆنۆمی و دە بازنەی نەتەوەیی ئێستاکە بەکورتی هەندێ زانیاری دەربارەیان دەخەینە ڕوو:

## ناوچەی دەریای ڤۆلگا

١. كۆماری كۆڵمیگا ، پایتەختەكەی شاری ئالیستایە، دانیشتووی ئەم كۆمارە پەیڕەوی دیانەتی بوزی دەكەن.
٢. كۆماری تاتارستان ، پایتەختەكەی شاری كازانە ، ئەم كۆمارە زۆربەیان موسڵمانن.
٣. كۆماری چوبایش ، پایتەختەكەی شاری چیبەكسارە .
٤. كۆماری ماری ، پایتەختەكەی شاری ئاولایە.
٥. كۆماری مەردۆڤیاپایتەختەكەی شاری مەردۆڤیایە.
٦. كۆماری كۆمی ، پایتەختەكەی شاری ستەفكارە دەكەوێتە ناوچە شاخاویەكانی ئۆراڵ.
٧. كۆماری ئەودومورتیا ، پایتەختەكەی شاری ئیژێڤسكە.
٨. كۆماری بەشكیریا ، پایتەختەكەی شاری ئوفەیە ئەم كۆمارە زۆر دەوڵەمەندە بە سامانی نەوت.
٩. كۆماری توفا دەكەوێتە سەر ڕووباری ئەلینیسی لە سیبریا ، پایتەختەكەی شاری كیزیلە.
١٠. كۆماری خاكاسیا ئەم كۆمارەش دەكەوێتە ناوچەی سیبریاوە ، پایتەختەكەی شاری ئاباكانە.
١١. كۆماری یاكوتیا، ئەم كۆمارە بە ڕووبەر گەورەترین كۆماری ڕوسیایە ، ئەوەی شایانی باسە پلەی گەرما لەم كۆمارەدا دەگاتە شەست پلە ژێرسفرەوە، پایتەختەكەی شاری یاكوتسكە. ئەم كۆمارە دەوڵەمەندە بە كانی ئاڵتون.
١٢. كۆماری بروتیا ، پایتەختەكەی شاری ئۆلانە. دەكەوێتە سەر دەریاچەی بایكاڵ لە سیبریا.

## ناوچەی قەوقاز

١. کۆماری کبەردینە-بەلکاریا ، پایتەختەکەی شاری نالچیکە.
٢. کۆماری ئۆسیتای باکوور ، پایتەختەکەی شاری ئەردەژەنکیزیایە.
٣. کۆماری چیچنیا، پایتەختەکەی شاری گرۆزنەیە.
٤. کۆماری داگستان ، پایتەختەکەی شاری مەخەچکەلەیە. لەم کۆمارەدا نزیکەی سی و دوو میللەت و نەتەوەی جیاجیا پێکەوە دەژین، لای خوێنەری کورد شاعیرو نووسەری گەورەی داگستان ( ڕسوڵ هەمزاتۆڤ) ناسراوە بەهۆی وەرگێرانی شیعرەکانیەوە بۆ زمانی کوردی.

## ئۆکرانیا

ئۆکرانیا لەیەکێتی سۆڤیەتی کۆندا بە دووەم کۆمارئەژمار دەکرا دوای ڕوسیا لە ڕووی توانای ئابووری و مرۆییەوە. پایتەختی ئۆکرانیا شاری (کییف) کە بە کۆنترین و جوانترین شاری ئەوروپا پۆلین دەکرێت. بە جۆرێك نازناوی شاری دایکانیان لێناوە، جگە لە کییف چەند شارێکی تری گەورەی پیشەسازی وەك دانێتسك، دنێپرەپیترۆڤسك، خارکۆف تێدایە. ئەوەی شایانی باسە نیمچە دوورگەی قرم (کریم) کە دەکەوێتە سەر دەریای ڕەش کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی ئۆکرانیایە. ساڵانە نزیکەی پازدە ملیۆن گەشتیار ڕووی تێدەکەن.

ئۆکرانیا بەسەدان سەنتەری زانستی و زانکۆو پەیمانگای تێدایە ، جگە لەوەش سەدان مۆزەخانەو شانۆی بەناوبانگی تێدایە. ئەوەی شایانی ئاماژە پێدانە بەهەزاران خوێندکار لە گشت جیهانەوە ئەمڕۆکە لە زانکۆو پەیمانگاکانی ئۆکرانیادا دەخوێنن . خۆشبەختانە ئەم چەند ساڵەی دوایی بە سەدان خوێندکاری کوردیش لەنێو ئەو خوێندکارانەدان.

## بێلەڕوس ( ڕوسیای سپی)

بیلەڕوس بەیەکێك لە کۆمارە پێشکەوتومکانی سۆڤیەتی پێشوو لە ڕووی پیشەسازی و کشتوکاڵەوە دەژمێردرێت. پایتەختەکەی شاری مینسکە ، کە بە یەکێك لە شارە مۆدێرنەکانی ئەوروپا لە قەڵەم دەدرێت ، دانیشتوانەکەی بە شێوەیەکی گشتی زمانی ڕوسی بەکاردەهێنن.

## کۆمارەکانی باڵتیك

کۆمەرەکانی باڵتیك بریتین لە سێ کۆمار
کۆماری ئیستۆنیا، لاتڤیا، لیتوانیا

## کۆماری ئیستۆنیا

ڕووبەرەکەی بریتییە لە چل و پێنج هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە ، پایتەختەکەی شاری تالینە ئەم شارە تابڵێت خنجیلانەو جوانە ، ئیستۆنیا دەکەوێتە سەر دوورگەی فینلەند، دانیشتوانەکەی نزیکەی سێ ملیۆن کەسە و ژمارەیەکی زۆر ڕوس لەم کۆمارەدا دەژین. ئەمڕۆکە ئیستۆنیا ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپادا.

## کۆماری لاتڤیا

ڕووبەرەکەی نزیکەی شەست و پێنج هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە ، پایتەختەکەی شاری ڕیگەیە ، ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی سێ ملیۆن کەس دەبێت. لاتڤیا ئەمڕۆکە ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپادا.

## کۆماری لیتوانیا

ڕووبەرەکەی نزیکەی شەست و سێ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیە ، دانیشتوانەکەی نزیکەی چوارملیۆن کەسە، پایتەختەکەی شاری ڤیلنیۆسە ، ئەم کۆمارەش ئەمڕۆکە ئەندامە لە یەکێتی ئەوروپادا.

## کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست

کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست بریتین لە پێنج کۆمار
کۆماری کازاخستان، تورکمێنستان، وزبێکستان، تالجیکستان، کیرگیزیا

## کۆماری کازاخستان

کۆماری کازاخستان گەورەترین ڕووبەری هەیە دوای ڕوسیا نزیکەی (٢،٧١٧ ) ملیۆن کیلۆمەتر چوارگۆشەیە ، ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی هەڤدە ملیۆن کەسە، پایتەختەکەی شاری ئەستانەیە ئەم کۆمارە دەوڵەمەندە بە سەرچاوەی نەوت و گازی سروشتی ، نزیکەی نیوەی دانیشتوانەکەی ڕوسن، وە ژمارەیەکی زۆر کوردیش لەم کۆمارەدا دەژین.

## تورکمێنستان

کۆماری تورکمێنستان ڕووبەرەکەی چوارسەدو هەشتاوهەشت کیلۆمەتری چوارگۆشەیە ، دانیشتوانەکەی نزیکەی چوار ملیۆن کەسە. پایتەختەکەی شاری ئەشخابادە. ئەم کۆمارە دەوڵەمەندە بە نەوت و گازی سروشتی، ئەوەی شایانی باسە زانایان لەم چەند ساڵەی دوایدا شوێنەوارێکیان دۆزیوەتەوە کە

دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەواریزمەکان کە بریتییە لە خانویەکی حەوت نهۆمی .

## وزبێکستان

کۆماری وزبێکستان ڕووبەرەکەی نزیکەی چوارسەدو چل و نۆ هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە دەبێت. ژمارەی دانیشتوانەکەی هەڤدە ملیۆن کەس دەبێت. ئەم کۆمارە بەناوبانگە بە بەرهەمی لۆکە ، نزیکەی (٢٠٪) ی لۆکەی جیهان بەرهەم دەهێنێت. جگە لەوەش مەڕومالاتێکی زۆریان هەیە. پایتەختەکەی شاری تاشقەندە ، شارەکانی بۆخارست و سەمەرقەند مێژوویەکی کۆنی هەیە جگە لەوەش گۆڕەکەی تەیموری لەنگ دەکەوێتە ئەو شارەوە.

## تاڵجیکستان

کۆماری تاڵجیکستان ڕووبەرەکەی نزیکەی سەدو چل وسێ هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی پێنج ملیۆن کەسە. پایتەختەکەی شاری دووشەنبەیە ، ئەم کۆمارەش بەناوبانگە بە بەرهەمی لۆکەو حەریر.

## کیرگیزیا

کۆماری کیرگیزیا ڕووبەرەکەی سەدوو نەوەت و نۆ هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە دەبێت دانیشتوانەکەی نزیکەی پێنج ملیۆن کەسە. پایتەختەکەی شاری بیشکێکە ، ئەم کۆمارە زۆربەی ڕووبەرەکەی شاخاویە زیاتر خەریکن بە بەخێوکردنی ئاژەڵ و کشتوکاڵەوە.

# کۆمارەکانی ناوچەی قەوقاز

**کۆمارەکانی قەوقاز بریتین لە سێ کۆمار**
**کۆماری ئەرمینیا، ئازەربایجان، جۆرجیا**

## ئەرمێنیا

کۆماری ئەرمێنیا ڕووبەرەکەی نزیکەی سی هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە و ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی چوارملیۆن کەس دەبێت. پایتەختەکەی شاری یاریڤانە.

ئەرمێنیا دەکەوێتە بەرۆکی شاخەکانی قەفقاز، زنجیرە شاخی ئارارات چواردەوری ئەرمێنیای پاراستووە ، پێش سێهەزار ساڵ لەمەوبەر ئەرمەنیەکان گەورەترین دەوڵەت بە ناوی ئۆراراتۆیان دامەزراندووە. چەندان شوێنەواری کۆن و مێژوویی لە ئەرمێنیا دۆزراوەتەوە ، کلتورو شارستانیەتی ئەرمەنی بە کۆنترین و دەوڵەمەندترین کلتووری جیهانی دەژمێردرێت. کوردێکی زۆر لەم کۆمارەدا جێنشینن.

## ئازەربایجان

کۆماری ئازەربایجان دەکەوێتە ڕۆژهەلأتی قەوقازەوە لەسەر دەریای قەزوین، ڕووبەرەکەی نزیکەی هەشتاوحەوت هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە دەبێت و دانیشتوانەکەی نزیکەی دە ملیۆن کەس دەبێت ، پایتەختەکەی شاری باکۆیە کە بە شارێکی دێرینی ئاسیای ناوەڕاست دەژمێردرێت ، ئەم کۆمارە دەوڵەمەندە بە سامانی نەوت. ئەوەی شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر کورد لەم کۆمارەدا دەژین.

## جۆرجیا

کۆماری جۆرجیا دەکەوێتە سەر دەریای ڕەش بەهۆی شاخەکانی قەوقازەوە بای باکووری سارد نایگرێتەوە بۆ یە زستان و هاوین گەرمە، ڕووبەرەکەی نزیکەی شەست سەدو نەوەت و حەوت کیلۆمەتر چوارگۆشەیە ، ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی شەش ملیۆن کەس دەبێت، پایتەختەکەی شاری تیبلیسە ئەم شارە یەکێکە لە شارە دێرینەکانی جیهان .

## هەندێ زانیاری گشتی بۆ گەشتیاران

کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو زیاتر لە نۆسەد شوێنی گەشتوگوزاری تێدایە چ سەردەریاکان یان ناوچە شاخاویەکان یان بیابان و ڕووبارەکان و دارستانەکان. جگە لەوەش زیاد لە چوارهەزار سەرچاوەی ناوی سروشتی تێدایە وە زیاتر لە سێ سەدو پەنجا بنکەی گەشتیاری کە زۆربەی شارەکانی گرتۆتەوە.

گرنگترین شوێنە گەشتوگوزاریەکان بریتین لە نیمچە دورگەی قرم وە هەروەها گاگرا، سۆچی ، سوخۆمی، وە چەندان شوێنی دیکە. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی گەشتوگوزار لە وولآتانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو پێویستە پەیوەندی بکرێت بە کۆمپانیا تایبەتەکان بە گەشتوگوزار وە هەروەها لە ڕێگەی پەیوەندیکردن بە باڵوێزخانەو کونسوڵخانەکانی ئەو وولآتانەوە.

# پیتەکانی ڕوسی و شێوەی دەربڕینیان

## Русский алфавит и произношения

### ڕوسکی ئەلفاڤێت ئی پرەیزنەشێنیا

| دەربڕین بە لاتینی | دەربڕین بە کوردی | پیتەکان بە بچووکی | پیتەکان بە گەورەیی |
|---|---|---|---|
| a | ئا | а | А |
| Be | ب | б | Б |
| Ve | ڤ | в | В |
| Ge | گ | г | Г |
| De | د | д | Д |
| Ye | ێ | е | Е |
| Yo | یۆ | ё | Ё |
| G | ژ | ж | Ж |
| Ze | ز | з | З |
| i | ئی | и | И |
| Yeh | ئی ی | й | Й |
| ka | ك | к | К |
| el | ل | л | Л |
| em | م | м | М |
| en | ن | н | Н |
| o | ئۆ | о | О |

| پیتەکان بە گەورەیی | پیتەکان بە بچووکی | دەربڕین بە کوردی | دەربڕین بە لاتینی |
|---|---|---|---|
| П | п | پ | pe |
| Р | р | ڕ | er |
| С | с | س | Es |
| Т | т | ت | Te |
| У | у | ئو | Ou |
| Ф | ф | ف | Cf |
| Х | х | خ | Kha |
| Ц | ц | تس | Tse |
| Ч | ч | چ | Tshe |
| Ш | ш | ش | Sha |
| Щ | щ | شش | shsha |
| Ъ | ъ | پیتی قورسکردن | |
| Ы | ы | ئئی | |
| Ь | ь | پیتی ناسککردن | |
| Э | э | ئێ | e |
| Ю | ю | یو | You |
| Я | я | یا | Ya |

## پیته دەنگدارەکان، بزوێنی، نابزوێنی

## Твёрдые и мягкие русские гласные буквы

### تڤیۆردی نی میاخکی ڕوسکی گلاسنی بوکڤی

پیته دەنگداره ڕوسیەکان بریتیه له بیست پیت ئەوانەش:

Б,В,Г,Д,З,К,Л,М,Н,П,Р,С,Т,Ф,Х

ئەو پیتانـه هەمیشه بەشێوەی بزوێنـی دەردەبڕێت تـەنها لـەو حاڵەتانـەدا نەبێت که له پاشیانەوه ئەم پیتانەی خوارەوه نەهاتبێت.

Ъ,Ь,Я,Ю,Е,Ё,И

بـەلام بـوونی ئـەو پیتانـەی سـەرەوه دوای پیتـه دەنگـدارەکان دەربڕینـی پیتەکانی دوای خۆیان ناسك دەکەنەوه.

ئەم سێ پیته Ж,Ц,Щ بەشێوەی (تلفص) نابزوێنی دەردەبڕێت .

بەلام ئەم دوو پیته Ш,Ч بەشێوەی بزوێنی دەردەبڕێت.

پیتی Б وەك پیتی (ب) کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونه :

| | | |
|---|---|---|
| Банк | بانك | بانك |
| Брат | برات | برا |
| Барабан | بەرەبان | تەپڵ |

پیتی В وەك پیتی (ڤ) کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونه :

| | | |
|---|---|---|
| Вода | ڤەدا | ئاو |
| Время | ڤرێمیا | کات |
| Воздух | ڤۆزدوخ | هەوا |

پیتی Г وەك پیتی (گ) ی کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونه:

| | | |
|---|---|---|
| Газета | گازێته | ڕۆژنامه |
| Герой | گیرۆی | پاڵەوان |
| Год | گۆد | ساڵ |

پیتی Д وەك پیتی (د) ی كوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Друг | دروگ | برادەر |
| Девушка | دێڤۆشكە | (كچ)كچەكە |
| Дом | دۆم | خانوو |

پیتی З وەك پیتی (ز) ی كوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Завод | زەڤۆد | كارگە |
| Зима | زیمە | زستان |
| Зонт | زۆنت | چەتر (سەیوان) |

پیتی К وەك پیتی (ك) ی كوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە :

| | | |
|---|---|---|
| Касса | كاسە | قاسە |
| Книга | كنیگە | كتێب |
| Квартира | كڤەرتیرە | شوقە |

پیتی Л وەك پیتی (ل) ی كوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Лето | لێتە | هاوین |
| Луна | لونە | مانگ |
| Лодка | لۆدكە | بەلەم |

پیتی М وەك پیتی (م) ی كوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Магазин | مەگەزین | كۆگا |
| Мир | میر | ئاشتی، جیهان |
| Москва | مەسكڤا | مۆسكۆ |

پیتی Н وەك پیتی (ن) ی كوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Назад | نازاد | بۆدواوە |
| Народ | نارۆد | گەل، میللەت |
| Нос | نۆس | لووت |

پیتی П وەك پیتی (پ) ی کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Парк | پارك | باخچە |
| Правда | پراڤدا | بەڕاست، ڕاستەقینە |
| Природа | پریرۆدە | سرۆشت |

پیتی P وەك پیتی (ڕ) ی کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Работа | ڕابۆتە | کار، ئیش |
| Рано | ڕانە | زوو |
| Родина | ڕۆدینە | نیشتمان، وولآت |

پیتی C وەك پیتی (س)ی کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Сила | سیلە | هێز |
| Слово | سلۆڤە | ووشە |
| Свобода | سڤەبۆدە | سەربەخۆیی، ئازادی |

پیتی T وەك پیتی (ت) ی کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Турист | توریست | گەشتیار |
| Театр | تیاتر | شانۆ |
| Торт | تۆرت | کێك |

پیتی Ф وەك پیتی (ف) ی کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Фраза | فرازە | ڕستە، گرێ |
| Финал | فینالٚ | کۆتایی |
| Фамилия | فامیلیا | ناوی خێزانی، لەقەب |

پیتی X وەك پیتی (خ) ی کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Хлеб | خليێب | نان |
| Худой | خودۆی | لاواز |
| Холодно | خۆڵەدنە | ساردە |

پیتی Ж وەك پیتی (ژ) ی کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Журнал | ژورناڵ | گۆڤار |
| Жизнь | ژیزن | ژیان |
| Жарко | ژارکە | گەرمە |

پیتی Ц وەك پیتی (تس) ی کوردی دەدەبڕدرێت وەك نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Царь | تسار | پاشا |
| Цирк | تسیرك | سێرك |
| Цифра | تسیفرە | ژمارە |

پیتی Щ وەك پیتی (ش) ی کوردی بە قورسی دەردەبڕدرێت بۆ نموونەك

| | | |
|---|---|---|
| Щенок | شینۆك | تولە سەگ |
| Щётка | شیۆتکە | فلچە (شانە) |
| Щи | شی | شلەی کەلەرم( خواردنێکی ڕوسیە) |

پیتی Ш وەك پیتی (ش) ی کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Шапка | شاپکە | کلاو (شەپقە) |
| Шарф | شارف | ملپێچ |
| Шутка | شوتکە | گاڵتەکردن (گاڵتەو گەپ) |

پیتی Ч وەك پیتی (چ) ی کوردی دەردەبڕدرێت بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Час | چەس | کاتژمێر (سەعات) |
| Число | چیسلۆ | بەروار |
| Чужой | چوژۆی | نامۆ |

## پیتە دەنگدارەکان

پیتی دەنگدار لە زمانی ڕوسیدا بریتین لە شەش پیتك
А,У,О,И,Э,Ы
بە شێوەیەکی گشتی پیتە دەنگدارەکان بزوێنین جگە لە پیتی (Ы) کە نابزوێنە.

دەربڕینی پیتی (ы) بۆ بێگانە ئاسان نییە ، زۆربەی بێیانیان وەك پیتی (ئی) کوردی دەریدەبڕن بەلام پێویستە لە گەرودا زۆربەگڕی ئەو پیتە دەرببڕدرێت. هەر لەبەر ئەو هۆیەش بە شێوەیەکی گشتی وەك ڕێسایەك ئەو پیتە دوای پیتە بزوێنەکان دێن. بۆ زیاتر ڕونکردنەوە سەیری ئەو ووشانەی خوارەوە بکەن کە پیتی (ы)یان تێدا بەکارهاتووە.

| | | |
|---|---|---|
| Сыр | سیر | پەنیر |
| Рыба | ڕیبە | ماسی |
| Улыбка | ولیبکە | زەردەخەنە |

## ڕێسای دەربڕینی وشەکان لە زمانی ڕوسیدا

ئەوەی زمانی ڕوسی لە زۆربەی زمانەکانی دیکە جیادەکاتەوە بوونی ووشەی (مەنبورە)یە واتە دانپیادانان بەسەر هەندێ پیتدا لە وەك شەدەی عەرەبی ، بە شێوەیەکی گشتی هێمای(/) لەسەر پیتەکە دادەنرێت، بۆ نموونە ووشەی(спект\акль) سپێکتاکل- نمایشکردنی شانۆیی. لە کاتی دەربڕینی ئەو ووشەیەدا پیتی (а) بە شێوەیەکی درێژکراوەیی دانی پێدادەنرێت.
ئێستاکە بۆ زیاتر ڕونکردنەوە سەیری ئەو نموونەیەی خوارەوە بکەن؛

| | | |
|---|---|---|
| Мясо | میاسە | گۆشت |
| История | ئیستۆریا | مێژوو |
| Памят | پامییات | پەیکەر |
| Дружба | درووژبە | برادەرێتی |
| Школа | شکۆڵە | قوتابخانە |
| Карандаш | کەرەنداش | قەڵەمی ڕەساس |
| Красивая | کراسسیڤەیا | جوان، قەشەنگ |
| Правда | پراڤدا | ڕاستی |

هەروەها دەمانەوێت سەرنجی خوێنەر بۆ تایبەتمەندیەکی تری زمانی ڕوسی ڕابکێشین پیتی (o) ئۆ، زۆربەی کات وەك پیتی (a) ئان دەردەبڕدرێت، بە تایبەتی لەو حاڵەتانەدا کە دەکەونە نێو وشەکە واتە جگە لە سەرەتاو کۆتایی ووشەکەز سەیری ئەو نموونەیەی خوارەوە بکەن:

| | | |
|---|---|---|
| Космос | کۆسمەس | بۆشایی ئاسمان |
| Овощи | ئۆڤەشی | سەوزەوات |
| Погода | پەگۆدە | کەش و هەوا |
| Золотои | زەڵەتۆی | ئاڵتونی |
| Дорого | دۆرەگە | گرانە |
| Дорогои | دەرەگۆی | بەڕێز |
| Вопрос | ڤاپرۆس | پرسیار |
| Восток | ڤەستۆك | ڕۆژهەڵات |
| Коротко | کۆرەتکە | کورت، بە کورتی |
| Молодой | مەڵەدۆی | لاو، گەنج |

# ناو

## Существительные

## سوشێستڤیتلنیٚ

### ڕەگەزی ناو

### پڕۆدی سوشێستڤیتلنیخ *Роды Существительных*

هەرچی ناوی ڕوسیە لە سێ ڕگەز پێکدێتك نێر، مێ، بێلایەن، ئەوەی جێگەی سەرنجە دەتوانین بەپێی کۆتاییەکان ڕگەزەکان دەستنیشان بکەین. بە شێوەیەکی گشتی ناوی نێر بە پیتە بزوێنەکان کۆتاییان دێت ، زۆربەی جار هێمای (ь) وە پیتی (и) دەکەونە کۆتایی ناوی نێرەوە، واتە ئەگەر ووشەکە کۆتاییەکەی بەو دوو پیتەی سەرەوە هات ئەوا ووشەکە نێرینەیە. بەلاٚم ناوی مێینە هەمیشە کۆتاییان بە هەردوو پیتی (я) یان(a) کۆتاییان دێت یان بە بە پیتە نابزوێنەکان. هەرچی ناوە بێلایەنەکانە کۆتاییان بە هەردوو پیتی (o) یان (e) دێت. سەرنج: هەرج ناوێك کۆتاییەکەی جێگیر و نەگۆڕ بێت ئەوا بێلایەنە جگە لە ووشەی (кофе) کۆفێ- قاوە، ووشەیەکی شازە بە نێرینە دەژمێردرێت هەرچەندە کۆتاییەکەشی بە پیتی (e) هاتووە .

## چەند نموونەیەك دەربارەی ڕەگەزی ناوەکان

| | | |
|---|---|---|
| Мужской род | موژسکۆی ڕۆد | ڕەگەزی نێر |
| Стол | ستۆڵ | مێز |
| Портфель | پارتفێل | جانتای دەستی |
| Трамвай | ترامڤای | پاسی کارەبایی |
| Женский род | ژێنسکی ڕۆد | ڕەگەزی مێ |
| Сестра | سێسترە | خوشك |
| Неделя | نێدێلیا | هەفتە |
| Вещь | ڤێش | کەل و پەل، شتومەك |
| Средний род | سرێدنی ڕۆد | بێلایەن |
| Слово | سلۆڤە | ووشە |
| Здание | زدانیێ | بینا، تەلار |
| Такси | تاکسی | تەکسی |

## نموونەی ئەو ناوانەی کۆتایەکەیان بە پیتی (Ь) دێت

| | | |
|---|---|---|
| Мужской | موژسکۆی | نێر |
| Апрель | ئاپرێل | نیسان |
| Гость | گۆست | میوان |
| Рубль | ڕۆبل | پارەی ڕوسی |
| Дождь | دۆژد | باران |
| Посетитель | پەسیتیتل | سەردان، بەسەرکردنەوە |
| Писатель | پیساتل | نووسەر |

| Русский | | |
|---|---|---|
| День | دێن | ڕۆژ |
| Любитель | لوبیتل | حەزکردن لە شتێك |
| Февраль | فێڤرال | شوبات |
| Женский | ژێنسکی | مێ |
| Площадь | پلۆشەد | گۆڕەپان |
| Церковь | تسێرکەڤ | کەنیسە |
| Дверь | دڤێر | دەرگا |
| Дочь | دۆچ | کچ |
| Мать | مات | دایك |
| Жизнь | ژیزن | ژیان |
| Молодость | مۆلەدەست | گەنجێتی |
| Память | پامیات | بیر، هزر |

# کۆی ناوەکان

## Существительные во Множественном числе

## سوشێستیتێلنیَ ڤە منۆژسڤێننۆم چیسلێ

لە زمانی ڕوسیدا ناوە نێرەکان بەهۆی ئەم پیتانەوە (а,и,ы,я) لە کۆتایی ووشەکەدا کۆ دەکرێنەوە.

ئەگەر هەردوو پیتی (и,ы) بچنە کۆتایی هەر ناوێکی مێینەوە ئەوا دەبێت بە کۆ. بەڵام هەردوو پیتی(а,я) بچنە کۆتایی هەر ناوێکی بێلایەن ئەوا دەبێت بە کۆ.

| Множественное число | Единственное число | کۆ/منۆژستڤێننەیَ چیسلۆ | تاک/ ئیدینستڤێننەیَ چیسلۆ | ڕەگەزەکان |
|---|---|---|---|---|
| Столы<br>Города<br><br>Мальчики<br>Портфели<br>Трамваи | Стол<br>Город<br><br>Мальчик<br>Портфель<br>Трамваи | ستۆل/ ستۆلی<br>گۆرەد/ گەرەدا<br>مالچیك / مالچیکی<br>پارتفێل/ پارتفێلی<br>ترامڤای/ ترامڤای | مێز/ مێزەکان<br>شار/ شارەکان<br>کوڕ/ کوڕەکان<br>جانتا/ جانتاکان<br>پاس/ پاسەکان | نێر |
| Сестры<br>Недели<br>Вещи<br>Фамилии | Сестра<br>Неделя<br>Вещь<br>Фамилия | سێستره/سوێستری<br>نێدێلیا/نێدێلی<br>ڤێش/ڤێشی<br>فامیلیا/فامیلیی | خوشك/ خوشکەکان(هەفتە/ هەفتەکان)<br>کەلوپەل/کەلوپەلەکان<br>خێزان/خێزانەکان | مێ |
| Слова<br>Здания<br>Окна | Слово<br>Здание<br>Окно | سلۆڤۆ/سلەڤە<br>زدانییَ/زدانیا<br>ئۆکنۆ/ئۆکنە | ووشە/ووشەکان<br>بینا/بیناکان<br>پەنجەرە/پەنجەرەکان | بێلایەن |

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە لە زمانی ڕوسیدا هەندێ ناو تەنها شێوەی تاك یان كۆ وەردەگرن.

ئەو ناوانەی كە تەنها شێوەی تاك وەردەگرن بریتین لە:

| | | |
|---|---|---|
| Внимание | ڤنیمانیێ | تێبینی‌سەرنج |
| Красота | كراسەتە | جوانی، ڤەشەنگی |
| Молодость | مۆلەدەست | گەنجێتی |
| Спорт | سپۆرت | وەرزش |
| Сахар | ساخەر | شەكر |
| Время | ڤرێمیا | كات |
| Газ | گاز | غاز |
| Физика | فیزیكە | فیزیا |
| Химия | خیمیا | كیمیا |

ئەو ناوانەی كە تەنها شێوەی كۆ وەردەگرن بریتین لە:

| | | |
|---|---|---|
| Туфли | توفلی | پێڵاو |
| Брюки | بریوكی | پانتۆڵ |
| Очки | ئەچكی | چاوێلكە، عەینەك |
| Деньги | دێنگی | پارە، دراو |
| Фрукты | فروكتی | میوە |

# شیکردنەوەی ناوەکان

## Склонение существительных

## سکلەنێنیێ سوشێستڤیتلنیخ

جیا لە زۆربەی زمانەکانی دیکە زمانی ڕووسی شەش حاڵەتە واتە ناوەکان یـان جـاوگەکان لـە شـێوەی ئاخاوتنـدا شـوێنەکەیان و کۆتاییـەکانیان لـە شـیکردنەوەدا بـەهۆی پیتـە پارمەتیدەرەکانـەوە دەگـۆڕێن.ئـەوەی جێگـەی سەرنجە هەر یەك ئەو حاڵەتانە ڕۆڵ و شوێن و پەیوەنـدی نێوان ووشـەکان لـە ڕسـتەکاندا دیـاری دەکـەن. ئێسـتاکە بـە کـورتی هـەر شـەش حاڵەتـەکانی شیکردنەوە ڕوون دەکەینەوە:

### حاڵەتی یەکەم

### Именительный падеж

ئیمێنیتێلنیی پادێژ الحالة الاسمية (الرفع)

ئەم حاڵەت جگە لە ڕونکردنـەوەی ڕۆڵی بکەر وەڵامی ئـەم پرسیارانەش دەداتە:

| | | |
|---|---|---|
| Кто؟ | کتۆ | کێ بۆ (زیندوو) |
| Что؟ | شتۆ | چی بۆ (بێگیان) |

### حاڵەتی دووەم

### Родительный падеж

ڕەدیتێلنیی پادێژ حالة المضاف اليه

ئەم حاڵەتە جگە لە ڕونکردنەوەی ڕۆڵی خاوەندارێتی (مالیك) وەلآمی ئەم پرسیارانەش دەداتەوە:

| | | |
|---|---|---|
| Кого؟ | کاڤۆ | کێ بۆ (گیاندار) |
| Чего؟ | چیڤۆ | چی بۆ (بێگیان) |

## حاڵەتی سێهەم

## Дательный падеж

داتێلنیی پادێژ حالة المقصود

ئەم حاڵەتە جگە لە ڕونکردنەوەی ڕۆڵی مبەستدار بە کارێکی ئاڕاستەکراو یان لە بەرژەوەندی یان لە دژی . وەلآمی ئەم پرسیارانەش دەداتەوە:

| | | |
|---|---|---|
| Кому؟ | کامو | بۆکێ بۆ(گیاندار) |
| Чему؟ | چیمو | بۆچی بۆ (بێگیان) |

## حاڵەتی چوارەم

## Винительный падеж

ڤینیتێلنیی پادێژ حالة المفعول به

ئەم حاڵەتە جگە لە ڕونکردنەوەی ڕۆڵی کارتێکراو وەلآمی ئەم پرسیارانەش دەداتەوە:

| | | |
|---|---|---|
| Кого؟ | کاڤۆ | کێ بۆ (گیاندار) |
| Что؟ | شتۆ | چی بۆ (بێگیان) |

## حاڵەتی پێنجەم

## Творительный падеж

تڤەریتێلنیی پادێژ الحالة الالية

ئەم حاڵەتە جگە لە ڕونکردنەوەی بەشداریکردن لە کارێکی دیاریکراودا وەڵامی ئەم پرسیارانەش دەداتەوە، لەم حاڵەتەدا هەمیشە پیتی (c) وەك پارمەتیدەر بەکاردەهێنرێت.

| | | |
|---|---|---|
| Кем؟ | کێم | کێ بۆ (گیاندار) |
| Чем؟ | چێم | چی بۆ (بێگیان) |

لەگەڵ کێ بۆ گیاندار دەوترێت (с кем) وە بۆ بێگیانیش دەوترێ لەگەڵ چی(с чем)

## حاڵەتی شەشەم

### Предложный падеж

**پرێدلۆژنییی پادێژ حالة الجار و المجرور**

ئەم حاڵەتە جگە لە ڕونکردنەوەی بابەتی بیرکردنەوە یان ڕوداوێك کە لەسەر کەسێك یان لەسەر شتێك ڕویداوە وەڵامی ئەم پرسیارانەش دەداتەوە، لەم حاڵەتەدا پیتی(о)وەك پارمەتیدەر بەکاردەهێنرێت.

| | | |
|---|---|---|
| О ком؟ | ئە کۆم | دەربارەی کێ بۆ (گیاندار) |
| О чём؟ | ئە چیۆم | دەربارەی چی بۆ (بێگیان) |

| Мужской род | موژسکۆی رۆد | رگەزی نێر | |
|---|---|---|---|
| Единственное число | ئدینستڤێنەیَ چیسلۆ | تاك | |
| حاڵەتەکان | تڤێردەیا Твердая | بزوێن | میاخکەیا نابزوێن Мягкая |
| حاڵەتی یەکەم | ماڵچیك Мальчик کوڕ | ستۆڵ مێز Стол | Портфель پارتفێل جانتاکە |
| حاڵەتی دووەم | ماڵچیکەМальчика کوڕەکە | Столаستۆڵە مێزەکە | پارتفێلیا جانتاکە Портфеля |
| حاڵەتی سێهەم | ماڵچیکو کوڕەکە Мальчику | ستۆڵو مێزەکە Столу | Портфелю پارتفێلیو جانتاکە |
| حاڵەتی چوارەم | ماڵچیکە کوڕەکە Мальчика | Стол ستۆڵ مێز | Портфель پارتفێل جانتاکە |
| حاڵەتی پێنجەم | Мальчикомماڵچیکۆم کوڕەکە | Столом ستۆڵەم مێزەکە | پارتفێلێم جانتاکە Портфелем |
| حاڵەتی شەشەم | نۆ ماڵچیکی دەربارەی کوڕەکە О Мальчике | نۆ ستۆڵێ دەربارەی مێزەکە О Столе | О Портфеле نۆ پارتفێلێ دەربارەی جانتاکە |

| Мужской род | موژسکۆی رۆد | رەگەزی نێر | |
|---|---|---|---|
| Множественное число | کۆ | | |
| حاڵەتەکان | Твердая | تڤێردەیا بزوێن | Мягкаяمیاخکەیا بزوێن |
| حاڵەتی یەکەم | ماڵچیکی کوڕەکان Мальчики | Столы ستۆلیی مێزەکان | Портфели پارتفێلی جانتاکان |
| حاڵەتی دووەم | Мальчиков ماڵچیکۆڤ کوڕەکان | ستۆلۆڤ مێزەکان Столов | Портфелейپارتفێلێی جانتاکان |
| حاڵەتی سێیەم | Мальчикам ماڵچیکەم کوڕەکان | Столам ستۆلەم مێزەکان | Портфелям پارتفێلیام جانتاکان |
| حاڵەتی چوارەم | ماڵچیکەڤ کوڕەکان Мальчиков | ستۆلیی مێزەکان Столы | Портфели پارتفێلی جانتاکان |
| حاڵەتی پێنجەم | Мальчиками ماڵچیکەمی کوڕەکان | Столами ستۆلەمی مێزەکان | پارتفێلیامی جانتاکان Портфелями |
| حاڵەتی شەشەم | О мальчиках ئۆ ماڵچیکەخ دەربارەی کوڕەکان | ئۆ ستۆلەخ دەربارەی مێزەکان О столах | О портфелях ئۆ پارتفێلیاخ دەربارەی جانتاکان |

| Женский род | ژێنسکی رۆد | رەگەزی مێ | |
|---|---|---|---|
| Единственное число | ئیدینستڤێنەیٚ چیسلۆ | تاك | |
| حاڵەتەکان | Твердая | تڤێردەیا بزوێن | Мягкая میاخکەیا نابزوێن |
| حاڵەتی یەکەم | سێسترە خوشك Сестра | Неделя نێدێلیا هەفتە | Вещь ڤێش کەلوپەل |
| حاڵەتی دووەم | Сестры سێسترِی خوشك | نێدێلی هەفتە Недели | Вещи ڤێشی کەلوپەل |
| حاڵەتی سێهەم | سێسترێ خوشك Сестре | Неделе نێدێلێ هەفتە | ڤێشی کەلوپەل Вещи |
| حاڵەتی چوارەم | Сестру سێسترو خوشك | نێدێلیو هەفتە Неделю | Вещь ڤێش کەلوپەل |
| حاڵەتی پێنجەم | سێسترەم خوشك Сестром | Неделеи نێدێلێی هەفتە | Вещью ڤێشیو کەلوپەل |
| حاڵەتی شەشەم | О сестре ئۆ سێسترێ دەبارەی خوشکەکە | О неделе ئۆ نێدێلێ دەربارەی هەفتە | ئۆ ڤێشی دەربارەی کەلوپەل О Вещи |

| Женский род | ژێنسکی رۆد | رەگەزی مێ | |
|---|---|---|---|
| Множественн<br>ое число | منۆژستفێنی<br>چیسلۆ | کۆ | |
| حاڵەتەکان | Твердая | تفێردەیا بزوێن | Мягкая<br>میاخکەیا<br>نابزوێن |
| حاڵەتی یەکەم | سیۆستری<br>خوشکەکان<br>Сестры | Недели<br>نێدێلی هەفتەکان | Вещи ڤێشی<br>کەلوپەلەکان |
| حاڵەتی دووەم | Сестер<br>سیوستر<br>خوشکەکان | نێدێل هەفتەکان<br>Недель | Вещей<br>ڤێشێی<br>کەلوپەلەکان |
| حاڵەتی سێیەم | سیۆسترەم<br>خوشکەکان<br>Сестрам | Неделям<br>نێدێلیام هەفتەکان | Вещам<br>ڤێشام<br>کەلوپەلەکان |
| حاڵەتی چوارەم | Сестер<br>سێستر خوشکەکان | نێدێلی هەفتەکان<br>Недели | Вещи<br>ڤێشی<br>کەلوپەلەکان |
| حاڵەتی پێنجەم | سێسترەمی<br>خوشکەکان<br>Сестрами | Неделями<br>نێدێلیامی<br>هەفتەکان | ڤێشەمی<br>کەلوپەلەکان<br>Вещами |
| حاڵەتی شەشەم | О сестрах<br>ئۆ سیۆسترەخ<br>دەربارەی<br>خوشکەکان | О неделях<br>ئۆ نێدێلیاخ<br>دەربارەی هەفتەکان | ئۆ ڤێشاخ<br>دەربارەی<br>کەلوپەلەکان<br>О вещах |

| Средний род | سرێدنیی رۆد | بێلایەن | |
|---|---|---|---|
| Единственное число | ئیدینستفێنەی چیسلۆ | تاك | |
| حاڵەتەکان | Твердая | تفێردمیا بزوێن | Мягкая میاخکمیا نابزوێن |
| حاڵەتی یەکەم | Письмо پیسمۆ نامە | ڤەسکرێسێنیێ یەك شەممە Воскресенье | Здание زدانیێ بینا(خانوو) |
| حاڵەتی دووەم | Письма پیسمە نامە | ڤەسکرێسێنیا یەك شەممە Воскресенья | Здания زدانیا بینا |
| حاڵەتی سێهەم | Письму پیسمو نامە | Воскресеньюڤەسکرێسێنیو یەك شەممە | زدانیو بینا Зданию |
| حاڵەتی چوارەم | پیسمۆ نامە Письмо | Воскресенье ڤەسکرێسێنیێ یەك شەممە | Здание زدانیێ بینا |
| حاڵەتی پێنجەم | Письмом پیسمۆم نامە | ڤەسکرێسسێنیێم یەك شەممە Воскресеньем | Зданием زدانیۆم بینا |
| حاڵەتی شەشەم | ئۆ پیسمێ نامە О письме | О воскресенье ئۆ ڤەسکرێسێنیێ دەربارەی یەك شەممە | ئۆ زدانییی دەربارەی بیناکە О Здании |

| Средний род | سرێدنیی ڕۆد | بێلایەن | |
|---|---|---|---|
| Множественное число | منۆژستڤێنۆیَ نیسلۆ | کۆ | |
| حاڵەتەکان | Твердая | تڤێردەیا بزوێن | Мягкая میاخکەیا نابزوێن |
| حاڵەتی یەکەم | پیسمە نامەکان Письма | Воскресенья ڤەسکرێسێنیا هەفتەکان | Здания زدانیا بیناکان |
| حاڵەتی دووەم | Письемپیسێم نامەکان | Воскресений ڤەسکرێسێنیی هەفتەکان | زدانیی بیناکان Зданий |
| حاڵەتی سێهەم | پیسمەم نامەکان Письмам | ڤەسکرێسێنیام هەفتەکان Воскресеньям | Зданиям زدانییام بیناکان |
| حاڵەتی چوارەم | Письма پیسمە نامەکان | Воскресеньями ڤەسکرێسێنیامی هەفتەکان | Здания زدانییا بیناکان |
| حاڵەتی پێنجەم | پیسمەمی نامەکان Письмами | ڤەسکرێسێنیامی هەفتەکان Воскресеньями | Зданиями زدانییامی بیناکان |
| حاڵەتی شەشەم | O письмах ئۆ پیسمەخ دەربارەی نامەکان | ئۆ ڤەسکرێسێنیاخ دەربارەی هەفتەکان О воскресеньях | ئۆ زدانیاخ دەربارەی بیناکان О зданиях |

## هەندێ سەرنجی پێویست

١- ناوە نێرینـەو بێلایەنـەکان لـە زۆربـەی حاڵەتەکانـدا لـە کاتی شیکردنەوەدا کۆتاییەکانیان لە یەك دەچێت.

٢- کۆی کۆتایی ڕەگەزی ناوەکان لە حاڵەتـەکانی ( یەکـەم، سێهەم و شەشـەمدا) وێکچوون .

ئەوەی پێویستە تێبینـی بکرێت بـە شێوەیەکی گشتی ناوەکان لـە حاڵەتی سێهەمدا بـە پیتـەکانی(ам,ям) کۆتاییـان دێـت، لـە حاڵـەتی پێنجەمـدا بـە پیتەکانی(ами, ями) لە حاڵەتی شەشەمدا بە پیتـەکانی (ях,ах).

٣- کـۆ کردنـی ناوەکـان لـە حاڵـەتی دووەمـدا کۆتاییـەکانیان لـە سـەر بنـەمای چـاووگی ووشـەکە دیـاری دەکرێـت نـەك لەسـەر شـیکردنەوەی ووشـەکە (حاڵەتەکان).

بۆ زیاتر تێگەیشتن سەیری ئەو نموونانەی خوارەوە بکەن،

ا- نـاوە ڕەگـەزە نێرینـەکان کـە کۆتاییـان بـە پیتـی بـزوێن دێـت بـەهۆی پیتەکانی (ов) کۆدەکرێنەوە.

بۆ نموونە

| | | |
|---|---|---|
| Журнал(Журналов | ژورنالْ (ژورنالەڤ) | گۆڤار( گۆڤارەکان) |
| Вечер(Вечеров) | ڤێچر(ڤێچێرۆڤ) | ئێوارە (ئێوارەکان) |
| Дом(Домов) | دۆم(دەمۆڤ) | خانوو(خانووەکان) |

ب- هـــەردوو ڕەگـــەزی (نێـــر و مـــێ) کـــە کۆتاییـــەکانیان بـــە پیتەکانی(ь,ж,ш.щ,ч) دێت ئەوا بە یارمەتی (ей) کۆدەکرێنەوە.

بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| Рубль(Рублей) | ڕۆبڵ( ڕۆبلێی) | پارەی ڕوسی |
| Площадь(Площадей) | پلۆشەد(پلۆشەدێی) | گۆڕەپان(گۆڕەپانەکان) |
| Гость(Гостей) | گۆست (گۆستێی) | میوان میوانەکان |
| Врач(Врачей) | ڤراچ(ڤراچێی) | پزیشك(پزیشکەکان) |
| Вещь(Вещей) | ڤێش(ڤێشێی) | کەلوپەل(کەلوپەلەکان) |
| Этаж(Этажей) | ئێتاژ(ئیتاژێی) | نهۆم(نهۆمەکان) |

ج- کۆی کۆتایی هەندێ ووشەو ناو دەگمەنن دور لە ڕێساکان بە تایبەتی لە حاڵەتی دووەمدا بۆیە دەبێت هەمیشە لە یادی نەکەن.

| | | |
|---|---|---|
| Иностранец(Иностранцев) | ئینۆستڕانتس(ئینۆستڕانتسێڤ) | بێگانە (بێگانەکان) |
| Брат(Братьев) | برات(براتێڤ) | برا (براکان) |
| Музей(Музеев) | موزێی(موزێیڤ) | مۆزەخانە(مۆزەخانەکان) |
| Друг(Друзей) | دروگ(دروزێی) | برادەر(بلادەرەکان) |
| Сын(сыновей) | سین(سینەڤێی) | کوڕم (کوڕەکانم) |
| Сосед(Соседей) | سەسێد(سەسێدێی) | دراوسێ(دراوسێکان) |
| Раз(Раз) | ڕاز(ڕاز) | جار(جارەکان) |
| Год(Лет) | گۆد(لێت) | ساڵ(ساڵەکان) |

د- هەندێ ناوی ڕەگەزی نێرینە لە حاڵەتی دووەمدا کۆتاییان بە پیتی(a)دێت وەك ڕەگەزی مێینە بۆ نموونە وەك:

| | | |
|---|---|---|
| Мужчина(Мужчин) | موشینە (موشسین) | پیاو(پیاوەکان) |
| Коллега(Коллег) | کۆڵێگە (کۆڵێگ) | هاوکار (هاوکارەکان) |

هـ- كۆی هەندێ ناوی مێینەو بێلایەن لە حاڵەتی دووەمدا تایبەتمەندێتی تێدایە بۆ نموونە وەك:

| | | |
|---|---|---|
| Марка(марок) | مارکە(مارك) | پوول(پوولەکان) |
| Выставка(Выставок) | ڤیستەڤکە(ڤیستەڤەك) | پێشانگا(پێشانگاکان) |
| Окно(Окон) | ئەکنۆ(ئۆکەن) | پەنجەرە( پەنجەرەکان) |
| (Девушек)Девушка | دێڤوشکە(دێڤوشك) | کیژ (کیژەکان) |
| Девочка(Девочек) | دێڤۆچکە(دێڤۆچك) | کچ (کچەکان) |
| Письмо(Писем) | پیسمۆ(پێسم) | نامە(نامەکان) |

و- كۆی ناوە مێینەکان لە حاڵەتی دووەمدا کۆتاییان بە (Ия) دێت، كۆی ناوە بێلایەنەکان کۆتاییان بە (Ие) یان بە(ИЙ) دێت.

| | | |
|---|---|---|
| Здание(Зданий) | زدانییێ(زدانییی) | تەلار(تەلارەکان) |
| Событие(Событий) | سەبیتیێ(سەبیتیی) | ڕووداو(ڕووداوەکان) |
| Операция(Операций) | ئەپێراتسیا(ئەپێراتسیی) | نەشتەرگەری(نەشتەرگەریەکان) |

ز- تێبینی بکە کۆ بۆ هەندێ ناوی مێینە لە حاڵەتی دووەمدا.

| | | |
|---|---|---|
| Жена(жён) | ژێنە(ژیۆن) | ژن(ژنەکان) |
| Неделя(Недель) | نێدێلیا(نێدێل) | هەفتە(هەفتەکان) |
| Сестра(Сестёр) | سیسترە(سیۆستر) | خوشك(خوشکەکان) |

ژ- تێبینی بکە هەندێ ناو کە لە حاڵەتی کۆ بەکاردێت.

| | | |
|---|---|---|
| Деньги(Денег) | دێنگ(دێنگی) | پارە(پارەکان) |
| Брюки(Брюк) | بریوکی(بریوك) | پانتۆڵ(پانتۆڵەکان) |
| Очки(Очков) | ئەچکی(ئەچکۆڤ) | چاوێلکە(چاوێلکەکان) |

| | | |
|---|---|---|
| Фрукты(Фруктов) | فروکتی(فروکتەڤ) | میوە(میوەکان) |
| Дети(Детей) | دیێتی(دیێتێی) | منداڵ(منداڵەکان) |
| Овощи(Овощеи) | نۆڤەشی(نۆڤەشێی) | سەوزە(سەوزەکان) |

گ- ووشــە بێیانیــەکان لــە زمــانی ڕوســیدا بــە بێلایــەن دەژمێــردرێن وە گۆڕانکاریـان بەسـەردا نایـەت، جگـە لـە ووشـەی(Кофе)کـە بـە نێرینـە دەژمێردرێت، ئەو ووشانەش بریتین لە:

| | | |
|---|---|---|
| Кафе | کەفێ | قاوەخانە(باڕ) |
| Метро | میترۆ | میترۆ(شەندەفەری ژێرزەوی) |
| Такси | تەکسی | تەکسی |
| Радио | ڕادیۆ | ڕادیۆ |
| Пальто | پاڵتۆ | پاڵتۆ |
| Кино | کینۆ | سینەما |
| Меню | مینیۆ | لیستی خواردن |
| Фойе | فەیێ | بالکۆن(هۆڵ) |

# ڕاناوەکان

## Местоимения

### مێستەئیمێنیا

ڕاناو لە زمانی ڕوسیدا لەبری ناو بەکاردێت، وەك ناوی(مرۆڤ،ئاژەڵ، شوێن، شتومەك)، ڕاناو ڕێگە دەگرێت لە دووبارەبونەوەی ناوەکان. ئەو ڕاناوانەش بریتین لە.

١- ڕاناوی کەسایەتی(الضمائر الشخصية)

Личные Местоимения — لیچنەیٚ مێستەئیمێنیا

٢- ڕاناوی خۆیی(ضمائر التملك)

Притяжательные Местоимения — پرەتیاژەتێلنیٚ مێستەئیمێنیا

٣- ڕاناوی نیشانە(ضمائر الاشارة)

Указательное Местоимения — وکەزاتلنەیٚ مێستەئیمێنیا

٤- ڕاناوی دیاریکردن(ضمير التحديد)

Определительное Местоимение — ئەپرێدیتلنەیٚ مێستەئیمینی

٥- ڕاناوی پرسیارکردن(ضمائر الاستفهام)

Вопросительные Местоимения — ڤەسپرەسیتلنییٚ مێستەئیمینیا

# ڕاناوی کەسایەتی

## Личные Местоимения

### لیچنییْ مێستەئیمێنیا

| | | تاک | | | کۆ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کەسی یەکەم(قسەکەر) | | Я | یا | من | Мы | می | ئێمە |
| کەسی دووەم | | Ты | تی | تۆ | Вы | ڤی | ئێوە |
| کەسی سێهەم (غائب) | نێر | Он | ئۆن | ئەو | Они | ئەنی | ئەوان |
| | مێ | Она | ئەنا | ئەو | Они | ئەنی | ئەوان |
| | بێلایەن | Оно | ئەنۆ | ئەو | Они | ئەنی | ئەوان |

سەرنج:

(Он)بۆ ڕەگەزی نێرینە بەکاردێت،(Она)بۆ ڕەگەزی مێینە بەکاردێت،(Оно)بۆ بێلایەن بەکاردێت.

## شێوگی راناوی کەسایەتی بەپێی شیکردنەوەی حاڵەتەکان

| حالەت | Я | Ты | Он Оно | Она | Мы | Вы | Они |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| حاڵەتی یەکەم | Я<br>یا من | Ты<br>تی تۆ | ئەنۆ،ئۆن ئەو<br>Он Оно | Она<br>ئەنا | Мы<br>می نێمە | Вы<br>ڤی | Они<br>ئەنی |
| حاڵەتی دووەم | Меня<br>مێنیا | Тебя<br>تیبیا | Его (Нeгоу)<br>نیڤۆ(و نیڤۆ) | (Её(у Неё<br>ییۆ (ونییۆ) | Нас<br>ناس | Вас<br>ڤاس | (Их(у Них<br>نیخ (ونیخ) |
| حاڵەتی سێیەم | Мне<br>منێ | Тебе<br>تیبێ | (Ему(К нему<br>نیمۆ(ك کنیمو) | (Ей(К ней<br>نێی( ك نێی) | Нам<br>نام | Вам<br>ڤام | (Им(К ним<br>نیم(ك نیم) |
| حاڵەتی چوارەم | مێنیا Меня | تیبیا Тебя | نیڤۆ)Его(в него<br>(ڤ نیڤۆ) | نیۆ)Её(в неё<br>(ڤ نیۆ) | ناس Нас | ڤاسВас | نیخ)Их(в них<br>(ڤ نیخ) |
| حاڵەتی پێنجەم | Мнои<br>منۆی | Тобои<br>تەبۆی | نیم(س نیم)<br>(Им(с ним | (Ей(с ней<br>نی (س نێی) | نامی Нами | Вами<br>ڤامی | (Ими(с ними<br>نیمی (س نیمی) |
| حاڵەتی شەشەم | Обо мне<br>ئەبە منێ | О тебе<br>لە تیبێ | О нём<br>لە نیۆم | О неи<br>لە نێی | نە O нас<br>ناس | О вас<br>نۆ ڤاس | О них<br>لە نیخ |

# ڕاناوی خۆیی

| | نێر | مێ | بێلایەن | کۆ |
|---|---|---|---|---|
| کەسی یەکەم تاک | Мои مۆی | Моя مەیا | Моё مەیۆ | Мой مۆی |
| کەسی دووەم تاک | Твой تڤۆی | Твоя تڤەیا | Твоё تڤەیۆ | Твой تڤۆی |
| کەسی سێهەم تاک | Его ئیڤۆ<br>Её ئیۆ<br>Его ئیڤۆ | Его ئیڤۆ<br>Её ییۆ<br>Его ئیڤۆ | Егоئیڤۆ<br>Еёییۆ<br>Егоئیڤۆ | Его ئیڤۆ<br>Её ییۆ<br>Его ئیڤۆ |
| کەسی یەکەم کۆ | Наш ناش | Нашаناشە | Нашеناشێ | Наши ناشی |
| کەسی دووەم کۆ | Ваш ڤاش | ڤاشە<br>Ваша | Вашеڤاشێ | Ваши ڤاشی |
| کەسی سێهەم کۆ | Их ئیخ | Их ئیخ | Ихئیخ | Их ئیخ |

سەرنج:-

ڕاناوی تەمەلوك(Их.её.его) بە هیچ شێوەیەك ناگۆڕێن، بەڵام ڕاناوە تەمەلوکەکانی تر دەگۆڕێن وەك ناوەڵناو کە کۆتاییەکانیان بە پیتی بزوێن دێت.

شتێك یان كەسێك(من، خۆم)

| | | |
|---|---|---|
| Свой | سڤۆی | (بۆ نێر) |
| Своя | سڤەیا | (بۆ مێ) |
| Своё | سڤەیۆ | (بێلایەن) |
| Свой | سڤۆی | (بۆ كۆ) |

## ڕاناوی نیشانە

## Указательное местоимение

### وكەزاتلنەیٚ مێستە ئیمینێ

ڕاناوی نیشانە هەمان كۆتاییان هەیە وەك ناو لە حاڵەتی یەكەمدا. وە شیتەڵ دەكرێتەوە وەك ناوەڵناو.

| | | |
|---|---|---|
| Этот | ئێتەت | ئەوە |
| Эта | ئێتە | ئەوە (بۆ مێ) |
| Это | ئێتە | ئەوە ( بۆ بێلایەن) |
| Эти | ئێتی | ئەوانە (بۆ كۆ) |

| ڕەگەز/ حاڵەتەکان | Мужской род موژسکۆی ڕۆد/ نێر | Женский род ژێنسکی ڕۆد/مێ | Средний род سرێدنی ڕۆد/ بێلایەن | Множественное число منۆژستفێنی چیسلۆ/ کۆ |
|---|---|---|---|---|
| حاڵەتی یەکەم | Этот ئێتەت | Эта ئێتە | ئێتە Это | Эти ئێتی |
| حاڵەتی دووەم | Этого ئێتەڤە | Этой ئێتۆی | Этого ئێتەڤە | Этих ئێتیخ |
| حاڵەتی سێیەم | Этому ئێتەمو | Этой ئێتۆی | Этому ئێتەمو | Этим ئێتیم |
| حاڵەتی چوارەم | ئێتەڤە، ئێتەت Этого. Этот | Эту ئێتو | Это ئێتە | Этих ئێتیخ |
| حاڵەتی پێنجەم | Этим ئێتیم | Этой ئێتۆی | Этим ئێتیم | Этими ئێتیمی |
| حاڵەتی شەشەم | Об этом ئەب ئێتەم | ئەب ئێتەت Об этот | Об этом ئەب ئێتەم | ئەب ئێتیخ Об этих |

سەرنج:- پیتی(Э) ڕوسی دەربڕینەکەی بە کوردی هەروەک(ئی) وایە، بەڵام دەبێت زۆر بە قوڵی لە قورگەوە دەربڕێت.

# ڕاناوی دیاریکردن

## Определйтельное местоимение

### ئەپریدێتلنەیٚ مێستەنیمینی

| ڕەگەز/ حاڵەتەکان | نێر | مێ | بێلایەن | کۆ |
|---|---|---|---|---|
| حاڵەتی یەکەم | Весь فێس | Вся فسیا | فسیۆ Всё | فسیۆ Все |
| حاڵەتی دووەم | Всего فسیڤۆ | Всей فسێی | Всего فسیڤۆ | Всех فسێخ |
| حاڵەتی سێیەم | Всему فسێمو | Всей فسێی | Всему فسێمو | Всем فسێم |
| حاڵەتی چوارەم | فسیڤۆ.فێس Всего.Весь | Все.Всю فسیۆ | Всё فسیۆ | Всех فسێخ |
| حاڵەتی پێنجەم | Всем فسێم | Всей فسێی | Всем فسێم | Всеми فسێمی |
| حاڵەتی شەشەم | ئەب فسیۆم Обо Всём | ئەب فسێی Обо Всей | ئەب فسێی Обо Всем | Обо Всех ئەب فسێخ |

سەرنج:- ڕاناوی دیاریکردن لە زمانی ڕوسیدا دوو جۆرن، جۆری یەکەم(весь.вся.всё.всу) واتە هەموو(هەمووی) بۆ کۆ، جۆری دووەم(такой.такая.такое.такие) واتە وەك ئەوە (وەك ئەوانە) بۆ کۆ.

| ڕەگەز/ حاڵەتەکان | نێر | مێ | بێلایەن | کۆ |
|---|---|---|---|---|
| حاڵەتی یەکەم | Такой تاکۆی | Такая تاکەیا | Такое تاکۆێ | Такие تاکیێ |
| حاڵەتی دووەم | Такого تاکۆڤە | Такой تاکۆی | Такого تاکۆڤە | Таких تاکیخ |
| حاڵەتی سێیەم | Такомуتاکۆمو | Такой تاکۆی | Такому تاکۆمو | Таких تاکیم |
| حاڵەتی چوارەم | Такого.Такой تاکۆڤە | Такую تاکویو | Такое تاکۆێ | Такие تاکیخ |
| حاڵەتی پێنجەم | Таким تاکیم | Такойتاکۆی | Таким تاکیم | Такими تاکیمی |
| حاڵەتی شەشەم | Таком تاکۆم | Такой تاکۆی | تاکۆم Таком | Таких تاکیخ |

# ڕاناوی پرسیارکردن

## Вопросительные местоимения

## ڤەسپرەسیتێلنەیٚ مێستەئیمینیا

| حاڵەتەکان | پرسیار بۆ کەس | پرسیار بۆ شمەك |
|---|---|---|
| حاڵەتی یەکەم | Кто کتۆ کێ | Что شتۆ چی |
| حاڵەتی دووەم | Кого کاڤۆ کێ | Чего چیڤۆ چی |
| حاڵەتی سێهەم | Кому کامو بۆکێ | Чему چیمو بۆچی |
| حاڵەتی چوارەم | Кого کاڤۆ کێ | Что شتۆ چی |
| حاڵەتی پێنجەم | Кем کێم کێ | Чем چێم چی |
| حاڵەتی شەشەم | О Ком<br>ئە کۆم دەربارەی کێ | О Чём<br>ئە چێۆم دەربارەی چی |

سەرنج:- شێوەی حاڵەتی شیکردنەوەی ڕاناوی پرسیارکردن بریتییە لە (Что. Кто) پرسیارکردنە لە کەسێك یان شتێك، دەربارەی کەسێك یان شتێك.

| ڕەگەز/ حاڵەتەکان | نێر | مێ | بێلایەن | کۆ |
|---|---|---|---|---|
| حاڵەتی یەکەم | Какой<br>کاکۆی | Какая<br>کاکایا | کاکۆێ<br>Какое | Какие<br>کاکیێ |
| حاڵەتی دووەم | Какого<br>کاکۆڤە | Какой<br>کاکۆی | Какого<br>کاکۆڤە | Каким<br>کاکیم |
| حاڵەتی سێهەم | Какому<br>کاکۆمو | Какой<br>کاکۆی | Какому<br>کاکۆمو | Каких<br>کاکیخ |
| حاڵەتی چوارەم | کاکۆی<br>Какого.Ка<br>кой | Какую<br>کاکۆیو | Какое<br>کاکۆێ | Какие<br>کاکیێ |
| حاڵەتی پێنجەم | Каким<br>کاکیم | Какой<br>کاکۆی | Каким<br>کاکیم | Какими<br>کاکیمی |
| حاڵەتی شەشەم | Каком<br>کاکۆم | کاکۆی<br>Какой | Каком<br>کاکۆم | کاکیخ<br>Каких |

## حاڵەتی ڕاناوە پرسیاریەکان بریتین لە

| | | |
|---|---|---|
| Где | گمدێ | لەکوێ |
| Куда | کودا | بۆکوێ |
| Откуда | ئەت کودا | لە کوێ وە |
| Когда | کاگدا | کەی |
| Как | کاك | چۆن |
| Почему | پەچیمو | بۆچی |
| Сколько | سکۆلکە | چەند |

**ڕاناوە نەفیەکان بریتین لە:**

| | | |
|---|---|---|
| Нечего | نێچیڤۆ | هیچ |
| Не | نێ | نا(نەخێر) |

**بەلاَم لە کاتێکدا پیتی(To) دەچێتە سەر ڕاناوەکان ماناکەی نادیار دەبێت.**

| | | |
|---|---|---|
| Куда-то | کودا-تە | ئایا بۆکوێ |
| Где-то | گەدێ-تە | ئایا لە کوێ |

چەند نموونەیەک:

Саман Разговаривает (с кем-то) по телефону

سامان ڕەزگەڤاریڤایەت (سکێم تە) پا تێلێفۆنو.

سامان لە گەڵ یەکێکدا بە تەلەفۆن قسە دەکات.

Наташа купила какую-то книгу

ناتاشا کوپیلە کاکۆیو-تە کنیگو

ناتاشا کتێبێکی کڕیوە

Ушел куда-то

وشۆڵ کودا تە

بۆ شوێنێک چووە

Что-то происходит

شتۆ تە پرەیسخۆدێت

شتێک ڕویداوە یان شتێک قەوماوە

# کردار

## Глагол

## گلاگۆڵ

شێوەی کردار لە زمانی ڕوسیدا، شێوەیەکی ڕەسەنە واتە (چاوگ) کە سێ حاڵەتی هەیە:

- شێوەی فرمانی ڕاگەیاندن(المرفوع)
- شێوەی فرمانی داخوازی(الرجاء)
- شێوەی فرمانی ئەمری(الامر)

وە هەروەها کردار لە زمانی ڕوسیدا سێ کاتی (زەمەنی) هەیە:

- کاتی ئێستا(المضارع)
- کاتی ڕابووردو(الماضی)
- کاتی داهاتوو( المستقبل)

جگە لەوەش کردار لە زمانی ڕوسیدا دوو ڕووکەشی هەیە:

- تەواوکراو
- تەواونەکراو

وە هەروەها شێوگی تایبەتی هەیە وەك:

-ناوی بکەر(اسم الفاعل)

- ناوی تەواوکەر( اسم المفعول)

# شیتەڵکردنەوەی کرداری

## Читат چیتات (خوێندنەوە)

### لە حاڵەتی ڕاگەیاندنی تەواونەکراودا

| Будущее<br>بودوشێ داهاتوو | پرۆشێدشێ ڕابوردوو<br>Прошедшее | Настоящее<br>ناستەیاشێ ئێستا |
|---|---|---|
| Я буду читаь<br>یا بودو چیتات ، من دەمەوێت بخوێنمەوە | Я читал-а<br>یا چیتاڵ من خوێندمەوە. | Я читаю<br>یا چیتایو من ئەخوێنمەوە |
| Ты будешь читать<br>تی بودیش چیتات، تۆ دەتەوێت بخوێنیتەوە | Ты читал-а<br>تی چیتاڵ تۆ خوێندتەوە | Ты читаешь<br>تی چیتایش، تۆ دەخوێنیتەوە |
| ئۆن بودێت چیتاتئەو دەیەوێت بخوێنێتەوە Он будет читать | ئۆن چیتاڵ ئەو خوێندیەوە<br>Он читал | Онئۆن читает<br>چیتایەت، ئەو دەخوێنێتەوە (نێر) |
| ئەنا بودێت چیتاتئەو دەیەوێت بخوێنێتەوە<br>Она будет читать | Она читала<br>ئەنا ئەو خوێندیەوە بۆ(مێ) | Онаئەنا читает<br>چیتایەت، ئەو دەخوێنێتەوە(مێ) |
| Оно будет читать<br>ئەنی بودوت چیتات، ئەوان دەیانەوێت بخوێننەوە | Оно читалоئەنۆ<br>چیتاڵە، ئەو خوێندیەوە(بێلایەن) | Они читают<br>ئەنی چیتایوت، ئەوان دەخوێننەوە |
| Мы будем читать<br>می بودێم چیتات، ئێمە دەمانەوێت بخوێنینەوە. | Мы читалиمی چیتالی، ئێمە خوێندمانەوە | Мы читаем می<br>چیتایم، ئێمە دەخوێنینەوە |

